ساڵی ١٣١١ھ ڕۆژیدا، دەڵێ لە ناوەندی ساڵی٥٩٩ و٦٠٠ھ دا تألیفکراوە.

لە پێشەکییەکی دیوانی بابا تاهیردا کە بەئینگلیزیی نوسراوە و لەلایەن خوالێخۆشبوو محەمەد عەلی عەونیەوە وەرگێڕاوەتە سەر عەرەبی، دەڵێ: ئەم کتێبی(راحة الصدور)ە، تألیفی نجم الدین أبی بەکر محەمەدی کوڕی سلێمانی راوەندییە، کە یەکێکە لە سەلجوقیەکان و دایناوە بۆ ابو الفتح کەیخوسرەوی کوڕی عەلائو الدولە، کە حاکمێکی سەلجوقی بووە.

لە پەراوێزی مێژووی ئەدەبی ئێران کە لەلایەن(ئەدوارد جرانڤیل براون)ەوە نوسراوە، دەڵێ: ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٣١م دا چاپکراوەو شاعیری گەورە و بزان، خوالێخۆشبوو سید محەمەد ئیقبال خانی لاهوری، راستکەرەوە(مصحح)ی بوە و ئەم راستکەرەوەیە، عەینی عیبارەتەکەی کاتبی نوسخە دەسنوسەکەی وەرگرتوە کە دەڵێ:"تمت في غرة رمضان سنة خمس و ثلاثين و ستمائة في يدى الضعيف المحتاج الي عفو رب الناس الياس بن عبدالله الحافظ القونوي حامدا علي نعمه، ومصليا على نبيه، محمد و آله واصحابه اجمعين" کەواتە ئەم کتێبە لە ساڵی ٥٩٩ و ٦٠٠ھ دا دانراوە و لە ساڵی ٦٣٥ھ دا ئەم نوسخەی پارسەی لەبەر نووسراوەتەوە و ئەو نوسخە دەستنوسە ئەمڕۆ، تاقانە نوسخەیە کە لە هەموو جیهانا کە ئێستا وا بە چاپکراویی بڵاوبۆتەوە.

لێرەدا زانای بەناوبانگ رەشید یاسمی لێکۆڵینەوەیەکی زۆر جوانی هەیە بۆ دۆزینەوەی ساڵی لە دایك بونی بابا تاهیر، دەڵی: ئەم چوونی توغرول پاشایە بۆ هەمەدان دەبێ لە ساڵی٤٤٧ تا ٤٥٠ھ دا بوبێ، چونکە وتەی(پیر) لە عیبارەتەکەی(راحة الصدور)دا با بەمەعنا پیری بەساڵاچوشا نەبێ، بەڵکو بەمەعنا پیری دەستگیربێ، بەڵام لە شێوەی قسەو گوفتوگۆکەی بابا تاهیر لەگەڵ پاشایەکی وەك توغرول بەگا و پێشکەوتنی لە هەردوو هاوڕێکانی خۆی لەقسەکردنا، دەردەکەوێ کە تەمەنی بابا تاهیر لەو رۆژدا لە پەنجا ساڵ کەمترنەبوە، ئەگەر زیاتر نەبوبێ، ئینجا بەم پێیە دەبێ بابا تاهیر لە ئاخر و ئۆخری سەدەی چوارەما لە دایکبوبێ.

بابا تاهیر لە چوارینەکەی پێشودا کە وتی:"الف قدم که در الف آمدستم" خۆی بە یەکێك لەو پیاوە گەورانە داناوە کە لەسەری هەموو هەزار ساڵێکا خوا یەکێکیان دەنێرێ، دیارە کە سەرەتای ئەم حیسابی هەزار ساڵە نابێ بە مێژووی کۆچی بێ، بەڵکو دەبێ بە مێژووی زاینی بێ، بەحیسابێکی کورت دەردەکەوێ کە مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی١٠٠٠ی زاینی لەگەڵ سەرەتای موحەرەمی ٣٩١ی کۆچی یەك دەگرنەوە، بەم پێیە لە دایکبونی بابا تاهیر لە ساڵی هەزاری زاینیی‌و لەساڵی ٣٩٠ یا ٣٩١ی کۆچیدا بوەو لەم مێژوەوە تا چوونی توغرول بەگ بۆ هەمەدان(١٠٥٥- ١٠٥٨) پەنجا وپێنج یا پەنجاو هەشت ساڵ دەبێ، کە ئەم قسەیە لەگەڵ قسەکەی میستەر براون یەك دەگرێتەوە.

بەم لێکۆڵینەوەیە دەرکەوت کە قسەکەی رەزا قولیخان کە لە(مجمع الفصحاء)دا کردی و وتی بابا تاهیر هاوچەرخی سەلجوقیەکان نەیوەو لە کاتی دەیلەمیەکاندا ژیاوە و لە ساڵی٤١٠ھ رۆژیدا کۆچی دواییکردوە، راست نیە و بە هەوەس کردوویەتی و قسەکەی بەرانبەر بە سەرچاوەیەکی مێژوویی گرنگی وەك(راحة الصدور) دەڕووخێ و خۆی ناگرێ.

مسیۆ(کلیمانت هوار) لە سەرەتای نامیلکەیەکیا دەڵێ: لە دەستنوسێکا کە ناوی(نزهة القلوب)ە تألیفی حمد اللهی مستەوفیی قەزوێنیە کە لە ساڵی٧٥٤ھ- ١٣٤٩م کۆچی کردوە لەو دەستنوسەدا چەند دێڕێکم خوێندەوە دەربارەی بابا تاهیر دەڵێ: بابا و(بیبی) فاتمەی خوشکی لە هەموو ئێرانا بە دوو ومرۆڤی بەهرەمەندی، خودا شناسی، دڵ ئاوەدانی، خاوەن دڵ و دەروون دەناسرێن.

هەروا لەتیف عەلی بەگی بێکدەلیی مەشهور بە ئازەر کە هاوچەرخی نادر شا بوە لە کتێبی ئاتەشکەدەیا کە لە ساڵی١١٧٤ھ رۆژیدا نووسیویەتی دەڵێ: بابا تاهیر دێوانەیەکی هەمەدانی و، عاشقێکی شێت و شەیداو، خاوەنی سۆزێکی بێپایان بوە، چوارینەی زۆری وتوە کە بەشی زۆری بڵندو باڵان.

لێکۆڵینەوەیەك کە زانای ئینگلیزیی(ئەدوارد هرن) کردوویەتی لە شاری بووشەهر دەرکەوتوە کە بابا تاهیر لەپێشەوە دارفرۆش بوە، بەم ڕەنگە بارەداری هێناوە لە شاخەکانی هەمەدان بۆ فرۆشتن، لە پاشا چوە بۆ یەکێك لە مەدرەسە دینیەکان و دانیشتوە لە بازنە(حەڵقە)ی دەرسا گوێی گرتووە لەو دەرسانەی کەوتراونەتەوە و لەو پرسیارانەی کە کراون و وەڵام دراونەتەوە، وا دەردەکەوێ کە بابا لەپێشەوە تێنەگەیشتوە لە دەرسەکان، رۆژێ لە فەقێکانی پرسیووە:"ئێوە چۆن لەم دەرسانە دەگەن"؟ ئەوانیش لە ڕوی تیتاڵیی و گاڵتە پێکردنەوە وتوویانە: ئێمە هەموو شەو دەچینە ناو حەوزوکەی مەدرەسەوە و چل جار خۆمانی تێهەڵدەکێشین، بۆیە واخوا زەینی رونکردوین و لە هەموو شتێك دەگەین، باباش بە دڵێکی پاگەوە ئەم قسەیە وەردەگرێ و باوەڕی پێدەکات و شەوی ئایندە دەچێتە سەر حەوزی مەدرەسەکەو بە بەرد سەهۆڵەکەی دەشکێنێ و دەچێتە ناوییەوەو چل جار خۆی تێهەڵدەکێشێت، دوای ئەوە وادەزانێ کەتیشکێك لە ئاسمانەوە دێو لە دەمیەوە دەچێتە ژوورەوە و بەوە ڕووناکیەك و فراوانیەك لە سنگی خۆیا بەدیی دەکات، بەیانی کە دەچێتە مەدرەسە زۆرباش لە دەرسەکان دەگات و لە فەقێکان چاکتر حاڵیی دەبێ بە ڕەنگێك کە دەکەوێتە کۆڵەکەدان(مجادله) لەگەڵ مامۆستا و فەقێکانا، لەمە هەموو سەرسام دەبن و لێی دەپرسن: ئەم زەین روونیی و زانینەت

چۆن دەستكەوت؟ ئەویش دەڵێ: ئێوە چۆن بەشەو چوونەتە ناو حەوزی مەدرەسەوەو چڵ جار خۆتان تێ هەڵكێشاوە، منیش وامكرد، ئنجا بەم بۆنەیەوە دەڵێ: "امسیت كردیا واصبحت عربیا" واتە لە ئێواریدا كورد بووم و لە بەیانیدا بووم بەدانا لە علومی عەرەبیدا، ئیتر دوای ئەوە، گەرمییەك لە لەشیا پەیدا دەبێ، بەجۆرێك لە هەر لایەك دابنیشتایە كەس نەیدەتوانی لەلایەوە دابنیشێ و هەمیشە بەسەر تەپڵەسەری شاخی ئەڵوەندەوە بوە، كە شوێنێكی زۆر ساردەو هەمیشە بەفری پێوەیەو كاڵایەكی زۆر تەنكی دڕاوی لەبەرابوە و هەر لەبەر ئەوەیە كە ناوی دەركردوە بە(عوریان) واتە ڕەشڕووت.

**(بابا تاهیری شاعیر)**

بابا تاهیر شاعیرێكی بەرز و باڵایە بە سروشت و عاشقێكی دڵسووتاوی دەروون برینداره بە جۆرێكی وا كە كاڵایەكی عاشقانەی بە باڵای خۆی بڕیوە، كە پۆی لە مەینەت و رایەڵی لە محەببەتە، وەك خۆی دەڵێ:

دڵێكم هەس كڕیداری محەببەت
لەلای ئەو گەرمە بازاڕی محەببەت
كراسێكم بە باڵای ئەو بڕیوە
لە پۆپی مەینەت و تانی محەببەت

بابا شاعیرێكی سروشتییە، هەزار ساڵە ڕەونەق و نازاویی(طراوة) شیعرەكانی خۆی پاراستوە و ئاگاداریی كردوە و لەم ماوە دوور و درێژەدا، دڵی دانا و نادانی وەك یەك ڕاكێشاوە بۆلای خۆی.

بەڵێ بابا هەر چەند مەردومێكی بێخانە و لانەو بێڕیشتە(علاقة) و پەیوەندیی بوە لەگەڵ جیهان و جیهانیانا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، تین و تەوژمێكی وای خستۆتە ناو چوارینەكانیەوە، شیعرەكانی ئێستاش هەر نەقشن لەسەر ڕووپەڕەی دڵان، تەنانەت ئەوانەی كە هاوزبان و هاونیشتمانیشی نین، هەر حەزیان لە شیعرەكانێتی و خۆشی و سۆزی لێ وەردەگرن و زۆر لە شیعرەكانییان وەرگێڕاوەتە سەر زبانی خۆیان بە هۆنراوە یا بە پەخشان. زۆری وا هەن كە سۆزی دڵی ئەم شاعیرە دڵسووتاوە بەجۆرێكی وا كاری كردۆتە سەر دڵیان و سەرمەستی گوفتاری ئەوی كردوون، كە خومارییەكەیان بە خوێندنەوەی شیعرەكانی ئەو نەبێ لاناچێ، وەك ئەم دوو چوارینەی كە دەڵێ:

بەسەر ڕووتا زوڵف قەفقەف كشاوە
كەوا سونبول بە گوڵ تێكەڵ كراوە
پەرێشان چۆن ئەكەی تۆ تاڵی زوڵفان
بەهەر تاڵێ دڵێ هەڵواسراوە
...

لەدەس چاو و لە دەس دڵ هەردو فەریاد
كە چاو هەرچیی ببینێ دڵ ئەكا یاد
ئەكەم من خەنجەرێ، نووكی لە پۆڵا
ئیتر ئەیدەم لە چاو، تا دڵ بێ ئازاد

بەڕاستی ئەم دوو چوارینەیە بەسەر هەر دڵمردوویەكا بخوێنرێتەوە، زیندووی دەكاتەوە و تەپوتۆزی مردنی لێ دوور دەخاتەوە، چ جای خومارێك كە بدا لەسەر.

زۆر كەسی وا هەن كە عەشق و شۆرێك لە دڵیانا هەیە و بەدرێژایی تەمەنیان ناتوانن بە زوبان باسێكی ئەو هەستەی خۆیان بكەن، بەڵكو لەم ڕووەوە زمانیان لاڵ و قەڵەمیان كوڵە لە دەربڕینیدا، بەڵام بابا تاهیر، بە زمانێكی كوردیی ڕەوان، باسی سۆزو شۆری دڵی ئەوان دەكات و سازی بابا لەگەڵ تاری دڵی ئەوانا ساز دەبێ و ڕێكدەكەوێ، هەردەمێ بابا لورەیەك بكات بە چوارینەیەك، خێرا تاری دڵی ئەوان دەكەوێتە پەلەپەل و باڵەتەپێ، یاخۆ هەر كاتێك بابا ناڵەیەك بكات و چوارینەیەكی خۆی بخوێنێتەوە، ئەوانیش لە خۆشیانا دەستدەكەن بە ناڵەناڵ، بەم ڕەنگە ئەگەر بابا بڵێ:

وەرن ئەی دڵ سوتاوان با بناڵین
لەدەس یاری بە بێ پەروا بناڵین
لەبۆ لای بولبولی شەیدا لە گوڵشەن
بچین، بولبول نەناڵێ تا بناڵین

وەیا بڵێ:

لەگەڵ سووتە دڵانم چۆن نەناڵم
لەگەڵ بێ حاصلانم چۆن نەناڵم
ئەناڵن بولبولانی ناو چڵ و گوڵ
كە من دووری گوڵانم چۆن نەناڵم

ئەوان كەیفخۆش دەبن، چونكە هاودەمێك و هاودەردێك بۆ خۆیان دەدۆزنەوە.

ئەگەر بڵێ:

دڵێكم هەس لە عەشقت گێژ و وێژە
برژانگ كە لێكدەم سێڵاوە ڕێژە
دڵی دڵداران وەك داری تەڕە
سەرێ گڕ، سەرێ خوناوە ڕێژە

ئەوان وەك شتێكی نایابی ونبوی خۆیان بدۆزنەوە، یا وەك ماننددی بێ نەوایەك كە گەنجێك بدۆزێتەوە، یا تینوویەك كە سەرچاوەی ئاوێكی ساردی سازگاری ڕووناك ببینێتەوە، لە خۆشیانا گەشكە دەیانگرێ.

بەڕاستیی ئاگرێك كە لە دڵی بابادا هەڵگیرساوە و زبانەی كێشاوە، ئاگرێكی هەتا هەتاییە، تا جیهان جیهانبێ، ئەو ئاگرە دەبریسكێتەوەو، ئاگری تر بەر دەداتەوە، وەك خۆی دەڵێ:

بە ئاهێ گونبەدی خە ضرا بسۆچەم
فەلەكرا جوملە سەرتاپا بسۆچەم
بسۆچەم ئەر نەكارمرا بساچیی
چ فەرمایی بساچیی یا بسۆچەم

واتە بە ئاهێك ئاسمان و زەویی ئەسوتێنم، ئەی کەریمی کارساز، ئەگەر کارم نەسازێنێت، هەموو جیهان دەسووتێنم، ئینجا دەفەرموێ، کارم دەسازێنێت، یا من ئاگر لە جیهان بەربدەم؟

دەڵێ:

منم ئەو ئاگرین تەیرەی کە دەرحاڵ
ئەسووتێنم زەمین لێکدەم پەڕ و باڵ
مصور گەر بکا نەقشم لە دیوار
ئەسووتێ خەڵق لەبەر تەئسیری تیمسال

لەم دوو چوارینەیەوە دەردەکەوێ کە بابا هێندێ جار مەستی بادەی خوایی و لە دەریای گەورەیی ئەودا نوقومبوە و ئاگای لە خۆی نەماوە و لەو کاتانەدا قسەی زلی بزرکاندوە، وەك(حەللاج) و(سوهرەوەردیی) و(ابن العربی).

بابا وەك دەردەکەوێ لە شیعرەکانیەوە نەماڵی بوە و نەحاڵ و هەمیشە بە کێوی ئەلوەندەوە بوە، بە ڕۆژ سوڕاوەتەوەو گژوگیای خواردوە، بەشەویش سەری کردۆتەسەر بەردێکی رەق، وەك خۆی دەڵێ:

من ئەو رەندەم کەوا ناومە قەلەندەر
نە خوانم هەس، نە نانم هەس، نە لەنگەر
کە رۆژداهات، لە دنیادا ئەخۆم خول
کە شەو داهات، لەسەر بەردێ ئەکەم سەر

دەڵێ:

چو مویەك سووتە دڵ پەروانەیێ نێ
بە عالەم هەمچو موو دیوانەیێ نێ
هەمە ماروون و مووروون لانە دێرن
منی دێوانەرا وێرانەیێ نێ

واتە لە جیهانا پەروانەیەك نیە وەك من دڵسوتاو، لە عالەما دێوانەیەکی وەك من نیە، هەموو مار و مووریێك هێلانەیەکی هەیە کە تیا بحەسێتەوە، منی دێوانە نەبێ کە هیچ وێرانەیەك شك نابەم.

دەڵێ:

منم ئەو بازە سپییەی هەمەدانی
کە هێلانەم لە کێوە بە نیهانی
بە باڵی خۆم ئەڕۆم لەم کەژ بۆ ئەو کەژ
بە دەستی خۆم ئەکەم نێچیرەوانی

بابا تاهیر وەك دەردەکەوێ لە هێندێ چوارینەیەوە سۆفییەکی پایە بەرزی باڵا و بڵندە، نابینێت لە سەرەتای تەمەنیەوە تا کۆچی دوایی، جارێك ئاوڕی نەداوەتەوە بەلای هیچ جۆرە خۆشیەکی دنیاوە، نە لەبابەت ژن و، نە لەبابەت ماڵ و منال و، نە لەبابەت خانوبەرەو، نە لەبابەت خواردن و خواردنەوەو، نە لەبابەت کاڵاو پۆشاك و، نە لەبابەت پەیوەندیی ناو مەردومەوە، زۆر لە چوارینەکانی لەگەڵ خوادایە کە دەڵێ:

کوێیە جێگای تۆ ئەی یاری دڵخوا
هەتا ئەو جێیە بکەم بە ڕێگا
هەموو جێ جێتە، کوێریی دەروونم
خەتام وت خەتا استغفرالله

لە شیعری یەکەمدا پرسیار لە جێی خوا دەکات، لەپاشا پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێ: خوایە تۆ بێجێگایت و جێگای تایبەتیت نیە، بەڵکو لە هەموو جێیەك هەیت و هەموو بونەوەر عەرشی تۆیە، بەڵکو عەرشی تۆ لە بوونەوەر فراوانترە وەك قورئان دەفەرموێ(وسع کرسیه السماوات والارض) واتە عەرشی پاشایەتی خوا لە ئاسمانەکان و زەویی فراوانترە، بەڵام من چاوی دەروونم کوێرە، لەبەرئەوە خەتاموت کە پرسیارم لە جێگاو ڕێگای تۆ کردو پەشیمان بومەوە و داوای لێخۆشبون دەکەم.

بەڵێ خوا لە هەموو شوێنێك هەیە و قەڵەمڕەوی زانینی هەموو بوونەوەرە، وەك لە ئایەتێکی ترا دەفەرموێ (وهو الله في السماوات و في الارض یعلم سرکم وجهرکم ویعلم ماتکسبون) واتە لە هەموو ئاسمانەکان و زەویدا هەر ئەوە خوا، کە بە هەموو نهێنیی و ئاشکرایەکتان ئاگادارەو ئاگای لە هەموو کردەوەیەکتان هەیە، ئەم خوا گەورەیە نە قەبارە(حجم)ی هەیە، نەڕەنگی هەیە، نەدەنگی هەیە، نە لە کەس دەچێ، نەوێنەی هەیە، وەك خۆی دەفەرموێ(لیس کمثله شیء) واتە لە هیچ دڵخوازێك ناچێ، بۆیە دەڵێ:

نازانم دڵم دێوانەی کێیە؟
لەکوێ ئەگەڕێ و لە خانەی کێیە؟
نازانم دڵەی ئاوارەی من
دیلی نێرگسی مەستانەی کێیە؟

دەڵێ:

بێ تۆ نابینم لە دنیادا کام
بێ تۆ ناگرم هەرگیز بەدەست جام
ئەلەرزم رۆژ و شەو وەك شۆڕەبی
بەبێ تۆ نیمە یەك نەفەس ئارام

تەماشا ئەم پایە بەرزە بکە کە بابا گەیشتوویەتێ لە خواناسیدا کە دەڵێ:

کە من وەك حوشترم قانیع بە خارم
خۆراکم دڕکو، خەروارێکە بارم
لەبەر ئەم خەرجە سووکە و بارە قورسە
لە رووی خاوەن، هەموو دەم شەرمەزارم

شیعری دووهەم لەم چوارینەیە بە هەڵە تەرجەمە کراوە، چونکە کە خەرج سووك و بار قورس بوو، ئیتر جێی شەرمەزاریی نامێنێ، شەرمەزاریی کاتێك دەبێ کە خەرج زۆر و بار سووك بێ، کەواتە

دەچنەوە بەردەمی، ئایا خێر و بەخشینەکەی لێگیراکردوون یا نا، چونکە موسوڵمان نابێ لە کردەوەی باشی خۆی دڵنیابێ کەگیراکراوەو هەمیشەدەبێ لە ناوەندی ترس و هیوا(خوف و رجا)دا بێ، تا نەنازێ و یاخی نەبێ.

موسوڵمان هەروەك بەچاکەی خۆی نابێ بنازێ و یاخی ببێ، وەك بە چوارینەی پێشو گەیاندی، بە گوناهێکیش کە لە دەستی دەرچێ نابێ بێ هیوابێ، وەك بەم چوارینەیە دەیگەیەنێ کە دەڵێت:

من ئەو ڕەندەمە گوناهە پیشەم
بە دەستێ جام و بە دەستێ شیشەم

گەر تۆ بێ خەتای ببە فریشتە
من لە حەواو و ئادەمە ریشەم

وەك لە شوێنی خۆی باسکراوە، فریشتە دروست کراوێکی خوان، هەرچی هەواو هەوەس و ئارەزوو بێ، تێیانا دروست نەکراوە، بەم ڕەنگە هیچ جۆرە ئارەزویەکیان نیە، تا لەپێناوی ئەوەدا تووشی گوناه بن، کەوابو گوناهنەکردنیان هیچ هونەرێکی تیانیە، بۆیە لە ڕۆژی دواییدا هیچ جۆرە پاداشێك نادرێنەوە لەسەر گوناهنەکردنیان، بەڵام ئادەمی زۆر جۆرە ئارەزووی تیا دروستکراوە، کە زۆرجار رایدەکێشێ بۆسەر گوناه، هەر وەك ژیریی و بیریشی پێدراوە، تا بیگێڕێتەوە لە خراپە، ئەوا پاداش دەدرێتەوە بە چاکە و ئەگەر ئارەزو رایکێشا بۆسەر خراپە، ئەوا تۆڵە دەدرێتەوە بەخراپە و دەشگونجێ کەخوا بە میهرەبانی خۆی بیبەخشێ، وەك ئادەم و حەوا کە یەکەم کەسبون گوناهیانکردو خوا لێیان خۆشبو.

واتە من ئادەمییەکم کە بۆ گوناه دروستکراوم، ئەگینا ئەم هەموو ئارەزووەم تیا دروست نەدەکرا، هەر کەسێك دەیەوێ بێگوناه بێ، بابچێ ببێ بە فریشتە و لە ئادەمی خۆی بشۆرێتەوە، من گوناهم بەکەلەپور(ترکە) بۆ بەجێماوە لە ئادەم و حەواوە.



شیعری دووهەم لەجیاتی وتەی (لەبەر) دەبێ (لەگەڵ) بێ، بەمڕەنگە:

لەگەڵ ئەم خەرجە سووکە و بارە قورسە
لە رووی خاوەن، هەموو دەم شەرمەزارم

ئەم چوارینەیەی، لەگەڵ خوایە، واتە ئەی خوای گەورە من وەك حوشتر خواردنم دڕکی موغەیلانە کە لەبەر زبریی و دڕی کەر نایخوات باریشم خەروارێکە کە بە قەد دوو بار قورس و گرانە لەگەڵ ئەم خەرجە سووکە و بارە قورسەدا هێشتا شەرمەزاری پەروەردگار و خاوەنی خۆمم، چونکە نازانم لێم رازییە یا نا و خواپەرستی و چاکەم لێگیرایە یا نا.

ئەم شیعرە ئاماژە(ئیشارە)یە بۆ ئایەتی ژمارە شەست لە سوورەی(مؤمنون) کە دەفەرموێ: (والذین یؤتون ما آتوا وقلوبهم وجلة انهم الي ربهم راجعون) واتە ئەوانەی کە دارایی خۆیان بەختدەکەن لە رێی خوادا و لەگەڵ ئەویشە بەدڵ هەر دەترسن لە خوا کە سبەی

لە مەعنای ئەم چوارینەیەدایە، دوو شیعری مفتی زەهاوی کە یەکێکیان بەفارسیی دەڵێ:

خطا برماست لازم تا شود غفاریش ظاهر

جزا اعدام میباشد گناه بی گناهیرا

واتە پێویستە لەسەر ئێمە کە ئادەمین گوناهکردن، تا خوا لێمان خۆش ببێ و لێخۆشبونی ئەو، دەرکەوێ بۆ هەموو کەسێك، ئەوانەی کە گوناهناکەن وەك فریشتە گوناهبارن، بۆیە لە ڕۆژی دواییدا حوکمی اعدام دەدرێن، بەم ڕەنگە زیندوو ناکرێنەوە و دەچنەوە پەردەی نەبوون. دووهەمیان کە بە عەرەبی دەڵێ:

لقد حرم الاملاك نيل خلافة

فما لهم ذنب سوى عدم الذنب

واتە فریشتە نەکران بەجێنشینی خوا لەسەر زەوی وەك ئادەمی، چونکە گوناهبارن، گوناهەکەشیان ئەوەیە کەوا بێگوناهن.

بابا لەو دڵبێدارانەیە کە هەمیشە دڵی ئاوەدان بوە بە یادی خواو یەك هەناسە خوای فەرامۆش نەکردوە، هەر وەك هەمیشە لە سەراپەردەی حوزوورا بوبێ وابوە، بۆیە لای بابا فەرقی کەعبەو کەنشتەو کڵێسەو دێرو بتخانە نەبوە، چونکە هەموویان بۆ ئەو چونیەك جیلوەگاهی خوابوون وەك دەڵێ:

خوشا ئانونکە ئەز سەر پا نەزوونەند

میانێ شوعلە خوشك و تەڕ نەزوونەند

کەنشت و کەعبە و بتخانەو دێر

سەراپا خاڵێ ئەز دلبەر نەزوونەند

وەك لەپێشەوە وتمان بابا تاهیر سۆفییەکی پایە بەرزبوە و هەمیشە لەبیری خوا و مردنابوەو سۆز و گوداز و نیاز و خەم و خەفەتی هەر یادی خوا و باسی مردنە، ئەوە کە هەژار و دەوڵەمەندو گەورە و پچوك و، داناو نادانی لەلا چونیەکە و ئامۆژگاری هەردولایان دەکات و دەڵێ:

ئەگەر جێگەت لە چەرخی چوارەمینە

کە هەرگا گورگی مەرگت لە کەمینە

ئەگەر سەد ساڵ لە دنیادا بمێنێ

کە ئاخر منزڵت ژێری زەمینە

دەڵێ:

وای بۆ ئەودەمەی ئەچمە گۆڕی تەنگ

ئەکەن بەسەرما خاك و خۆڵ و سەنگ

نە پێیەکم هەس لە ماران راکەم

نە دەستیش لەگەڵ مورا بکەم جەنگ(٦)

دەڵێ:

بە گۆڕستان گوزەر کردم کەم و بێش

بدیدم گۆڕی دەوڵەتمەند و دەروێش

نە دەروێش بێ کفن دەرخاك رەفتە

نە دەوڵەتمەند بردە یەك کفن بێش

واتە زۆر هاتوچۆی گۆڕستانم کرد و زۆر گۆڕی هەژار و دەوڵەمەندم چاوپێکەوت، تائێستا نە هەژارێکم دی بێکفن بنێژرێ و نە دەوڵەمەندێکم دی لە کفنێك زیاتر لەگەڵ خۆی بەرێ.

چوارینەکانی بابا تاهیر زۆریان لەیەك دەچن لە عیبارەت و لەمەبەستاو ئەوانە زۆر بەرز نین، هەر لەبەرئەوەیە کە خۆیشی داندەنێ بە پەستی هێندێکیانا و دەڵێ:

هەر ئەو دلبەرەی چاوی مەستی هەس

هەزارانی وەك، من پابەستی هەس

لەناو عاشقانە ئەو مانگ روخسارە

وەك شیعری من بەرز و پەستی هەس

بەڵام گرنگی و قورسی ئەم دوو چوارینەیەی کەوا ئێستا کە بەرەودوا دێن لەوانەیە کەببێ بە پارسەنگی ئەو شیعرانەی کەوا لە ترازووی کێشانا سووکن، بەجۆرێك کە هەموویان قورس بکات و کەموکوڕییان داپۆشێ، چوارینەی یەکەم دەڵێ:

گوڵێ بەدەس خۆم پەروەردە بکرێ

لە چاوگەی چاوی خۆم ئاوی بدرێ

کەی ڕەوای دەرگای پەروەردگار

یەکێ تر بۆ خۆی گوڵاوی بگرێ(٧)

چوارینەی دووهەم دەڵێ:

درەختی غەم لە دڵ کردوویە ریشە

لە دەرگای خوا ئەناڵێنم هەمیشە

عەزیزان با بزانین قەدری یەکتر

ئەجەل وەك بەردە، مەردوم چەشنی شیشە

وەزنی چوارینەکانی بابا تاهیر لەگەڵ چوارینەکانی عومەر خەیام کەمێك جیاوازن، بەم ڕەنگە هینەکانی بابا لەسەر وەزنی (هەزەجی شەش پارچەیی محزوف)ە، واتە هەموو شیعرێکی شەش(مفاعیل)ن، بەڵام تفعیلەی سێهەم و شەشەم کورت دەکرێنەوە بۆ(مفاعل) یا(فعولن).

مەردوم ئەگەر ورد ببێتەوە لە شیعرەکانی بابا تاهیر و بەراوردی بکات لەگەڵ زۆر لە شیعرەکانی عومەر خەیام لە رووی عیلمی نەفسەوە، دەبینێ کە ئەم دوانە زۆرلەیەکەوە دوورن، چونکە تائێستا بابا هیچ ئاوڕێکی نەداوەتەوە بەلای خۆشی و خۆش ڕابواردنی جیهانەوە، بەپێچەوانەی خەیام، کە بەلایەوە هەر خۆشی و خۆش ڕابواردنی جیهانە ئامانجی هاتنە جیهان، جگەلەوەی کە شیعرەکانی خەیام بە هیچ کولۆجێك تررووسکەیەکی تەصەوفی لێوەنایەت، هەروەك لە شیعرەکانی باباوە دێت بە زۆریی(٨).

## (زبانی بابا تاهیر)

بابا تاهیر کوردێکی لوڕە، لوڕ ناوی تیرەیەکی گەورەیە لە کورد(٩) ئەم چوارینانەشی بە زبانی لوڕییە.

میستەر براون لە ئێران پرسیاری کردوە لە زانایەکی گەورەی کرمانی: کە زمانی بابا تاهیر چیە؟ ئەویش وتوویەتی لوڕییە، کە ئەم زمانە بڵاوە لە شیراز و ئیسفەهانا، هەر وەك زانای بەناوبانگ(جونییو)یش لایوایە.

ئەگەر ئێمە وردببینەوە لە چوارینەکانی بابا، دەبینین کە پڕە لەوتەی لوڕی، وەك (ئیمبون) لەجیاتی(ایمان) و(باروون) لە جیاتی(باران) و(بیابوون) لە جیاتی(بیابان) و(تە) لەجیاتی(تۆ) و(دەرموون) لەجیاتی(دەرمان) و(دێر) لەجیاتی(دوور) و (نوم) لەجیاتیی(نام) بەمەعنا ناو و(نوومە) لەجیاتیی(نامە) کە ئەمانە هەمووی هەر لە زبانی لوڕیدا بەکاردەهێنرێن.

**(دیوانی بابا تاهیر)**

وادەردەکەوێ کە لەکاتی بابا تاهیردا نەخۆی و نەکەسی تر شیعرەکانی کۆنەکردۆتەوە، بەڵکو هەر چوارینەیەکی کەوتۆتە لای یەکێك، ئینجا سا یا لەپشتی کتێبێك، وەیا دەفتەرێك وەیا بەیازێك نوسراوە، تا ساڵی١٨٨٥م کە زانای خۆرهەڵات ناس(مستشرق)(هیوار) (٥٩) چوارینەی تریشی لەگەڵ چامەیەکیا بڵاوکردەوە لە ساڵی١٩٠٨م.

لە پاشا خۆرهەڵاتناس(هرون ئلن) (٨٠) چوارینە و چامەیەکی، بێجگە لەوانەی کە(هیوار) بڵاویکردبوونەوە تەرجەمەی کردن بە پشتیوانی دەستنوسێکی نامەخانەی بەرلین.

لە ساڵی١٣٠٦ھ ڕۆژی-١٩٢٧م حسین وحید دستجردی ئیسفەهانی، نووسەری گۆڤاری ئەرمغانی فارسی- دیوانی بابا تاهیری لە چاپدا و بڵاوی کردەوە، کە٢٩٦ چوارینە و چوار چامەیەو(٦٢) چوارینەی تریشی کردوە بە پاشکۆی ئەم دیوانە کە دەریهێناون لە کەشکۆڵ و بەیازی دەستنوس.

لە ساڵی١٣١١ھ ڕۆژی- ١٩٣٢م دووبارە دیوانەکەی بابای چاپکردەوە بە پێشەکیەکی مامۆستا ڕەشید یاسمیەوەو(١٠) چوارینەی تری لێزیادکرد کە لە چاپی یەکەما نەبوون.

ئەم شیعرانە بەپێی پیتی دوایی ریزکراون، بەم ڕەنگە ئەوی دواپیتەکەی(ئەلف) بێ پێش ئەوانە خراون کە دواییەکەیان(بێ) بێ‌و هەر بەم ڕەنگە تا پیتی(یێ).

ئەم دیوانی بابا تاهیرە، لەماوەی ئەم هەزار ساڵەدا، چەند جار شیعرەکانی نوسرابێتەوە لەلایەن ئێرانیەکانەوە، هەر جارەی چەند وتەیەکی کوردی لێکراوە بە فارسی، بەجۆرێك کە ئێستا کاڵایەکی فارسی بەسەرهاتوە، بەم ڕەنگە(ئامێتە)کراوە بە(ئامێختە) و(تاو) کراوە بە(تاب) و(تە) کراوە بە(تو) و(ڕێژە) کراوە بە(ریزد)و(شەو) کراوەبە(شەب) و(کرن) کراوە بە(کنند) و(موو) کراوە بە(من)و (مەکە) کراوەبە(مکن) و(وتم) کراوە بە(گۆیەم)و (وینەم) کراوە بە (بینەم).

بەڕاستی زۆر جێیداخ و خەفەتە کە تائێستا دەستنوسێکی کۆنی ئەم دیوانە نەدۆزراوەتەوە، نە لە ڕۆژهەڵات و نە لە ڕۆژئاوا، تابکرێ بە سەرمەشق و ئەم دیوانەی لەبەر ڕاستبکرێتەوە.

**(بابا تاهیری سۆفیی)**

بابا تاهیر سۆفییەکی خواپەرستی، بێناوونیشانی، گۆشەگیری، بێنیازی، خاوەن دڵ بوە، ٢٢ تالیفی هەیە لەعیلمی ما بعد الطبیعە(میتافیزیقیا)دا(١٠) هێندێکی بە زبانی فارسی و هێندێکی بە عەرەبی، ئەوی لەم کتێبانە کە تائێستا لە چاپدرابێ، تەنیا یەکێکیانە کە ناوی (کلماتی قصار)ەو بەعەرەبی نووسراوە لە بیروباوەڕ(عقائد)ی ئەهلی تەصەوفدا و چاپکراوە لەداوێنی دیوانەکەیەوە لە چاپی دووهەم بە چاپی ئەرمەغان، کە دانەیەکی لە نامەخانەکەی منا هەیە و تائێستا ئەم نامیلکەیە زۆر ڕاڤە(شرح)ی لێکراوە، یەکێکیان راڤەی(عین القضاة)ی هەمەدانیە کە لە ساڵی ٥٣٣ھ کۆچی دواییکردوە و بە عەرەبی کردویەتی، هەروەك لە کۆنەوە راڤەیەکی تریشی لێکراوە بە عەرەبی، بەڵام خاوەنەکەی تائێستا نەزانراوە کێیە، لەم سەردەمی دواییەدا زانای گەورە مەلا سوڵتان عەلی گونابادی دوو راڤەی لێکردوە، یەکێکیان بە فارسی و ئەوی تریان بە عەرەبی و راڤە فارسیەکەی لە دەوروبەری ساڵی ١٣٢٦ھ ڕۆژیدا لە چاپ دراوە، ئەم نامیلکەی بابایە٣٦٨ پەندو حیکمەتە بە عەرەبی کە بابا تاهیر خۆی داینا‌وەو ڕێکیخستون لە ٢٣بابا، قسەدەکەن لە عیلمو، تەصەوفو، وجدو زکرو، عقڵ، غفلەو، نفس... هتد. ئەمە چەند میسالێکە بەنموونە بۆت دەهێنمەوە:

١. العلم موكل بالكلام، والوجد موكل بالخرس، ژمارە(١١).

٢. التصوف لايسعه شيء وهو يسع الاشياء كلها، والصوفي يكون له كل شيء ولايكون هو لشيء، ژمارە(٣٢٠).

٣. الوجد فقدان الموجودات، ووجود المفقودات، ژمارە(٩٦).

٤. الذكر الخفي الذي يخفي عن القلب، ژمارە(١٣٢).

٥. انتهاء العقل الي التحير، وانتهاء التحير الي السكر، ژمارە(٦٥).

٦. الغفلة عن الله كفر، والغفلة عن حقيقة ذات الله توحيد، ژمارە(٣٢١).

٧. النفس سجن الروح، والدنيا سجن النفس، ژمارە(٦٦)

دەستنوسی ئەم(کلماتی قصار)ە لە ساڵی٨٥٣ھ ڕۆژی، دەست پیرێك کەوتوە کە ناوی(أبو البقا)بوە و ویستویەتی راڤەی لێبکات و شەرحی لەسەر بنوسێ و کتێبەکەی لەلا زۆر خۆشەویست و بەنرخ بوە، تەنانەت لەگەڵ خۆی بردوویەتی بۆ مەککە و لەوێ لە باخەڵی دەکەوێتە ناو بیری زەمزمەوە، بەڵام بە هەوڵ و تەقەلایەکی ئێجگار زۆرگران دەریدەهێنێ، زانایان و خوێندەوارانی بەرز زۆر هەوڵ دەدەن لەگەڵ أبو البقادا کە راڤە لەو دەستنوسەنەکات، چونکە ئەو فەرمودانەی بابایە زۆر بەقوڵی پێچراوەن، بەرەنگێك کە کەم کەس نەزانێ، ئینجا ابو البقا دەستنووسەکە دەدا بە گەورەترین زانا کە

چانی بەگی عزیزی بوە و تکای لێدەکات کە راڤەی لێبکات، چانی بەگیش لە مانگی شەوالی ٨٩٠ھ رۆژی دەستدەکات بە راڤە لێکردنی و لەبیستی شەعبانی٨٩٩ھ تەواوی دەکات(١٠).

## خوابگاهی بابا تاهیر

خوا بگاهی بابا تاهیر لە ژوورێکدایە بەسەر تەپەیەکی نە زۆر بەرزی نە زۆر نزم، لە رۆژئاوایەکی باکوری شاری هەمەدانەوە و لەو گەڕەکەی کەپێی دەڵێن(بن بازار)، لەو ژوورەی کە بابای تیا نێژراوە، دوو کەسی تریشی تیا نێژراوە، یەکێکیان دایەنی خۆیەتی کە شیری داوەتێ و ناوی فاتمەیە، ئەوی تریان حاجی میرزا عەلی نەقی کەوسەرییە و گۆڕی هەرسێکیان قەفەزەیەکی سادەی دارینی بەسەرەوەیە. خوابگاهی بابا هەمیشە زیارەتگاهی موسوڵمانانی دڵبێدارانە، کۆنترین کتێبێك کە باسی ئەم خوابگاهە بکات(نزهة القلوب)ی حمد ئیلاهیی مستوفیە، کە لە ساڵی ٧٥٠ھ، کۆچی دوایی کردوە، بە دەوروبەری خوابگاهەکەی بابا تاهیردا چەند ژوورێك هەن هەمیشە چەند کەسێکی تیان لە موریدینی بابا کە خواپەرستی تیادەکەن و چلەی تیا دەکێشن، نەخوازەلا شەوی جومعان، وێنەی ئەم خوابگاهە لە چاپی دووهەمی دیوانەکەیا کێشراوە. درووودی خوا برژێ بەسەر گۆڕەکەیا وەك بارانی بەهار.

پەراوێز:

١. ئەم چوارینانەی باباتاهیر لەلایەن شاعیری تازەی بەهرەمەند کاك دڵزاری کۆییەوە هەوڵدراوە کە بکرێن بە کوردی سۆرانی، بەڵام بەداخەوە هەر حەفتاو حەوت چوارینەی تائێستا بۆ کراوە و بەتایبەتی لە چاپیداوەو ناوی‌ناوە(گەنجینە) و بەشی زۆری هەروەك خۆی ماوەتەوە و ئەم چوارینەیە، یەکێکە لەو چوارینانەی کە لەلایەن ئەوەوە وەرنەگێڕاوە، ساخوا بەمیهرەبانی خۆی یارمەتی بدات بۆ تەواوکردنی ئەم پرۆژە پیرۆزە.

٢. وەك لە گۆڤاری (ئەرمەغان)ی ژمارە(١) ساڵی(١٠) دەڵێ: هیندێ چوارینە کە بەهی بابا تاهیر زانراون، لە دیوانی مەلا محەمەدی مازندەرانی و شاتریەگی محەمەدی هەمەدانیدا بینراون.

٣. واتە قەد و باڵا ڕاست وەك ئەلف.

٤. توغرول: محەمەد کوری میکائیلی کوری سەلجوقی کوری تقلقە، کە لە ساڵی٤٣١ھ دا بوە بە پاشا و زاڵبووە بەسەر مەسعودی کوری سوڵتان مەحمودی غەزنەویدا و دەستیگرت بەسەر خوراسانا و لە ساڵی٤٣٣ھ دا، تبرستان و گورگان و، لە ساڵی٤٤٦ھ دا، ئازربیجان و، لە ساڵی٤٤٧ھ دا بەغدای گرت و دوان(خطبة)ی جومعانی بەناوی ئەوەوە خوێندرایەوە، هەر لەو ساڵەدا موسڵ و دیاربەکری گرت و لە ساڵی٤٥٤ھ دا، کچی خەلیفەی القائم بأمر اللەی مارەکرد و لە ساڵی٤٥٥ھ دا مرد.

٥. حەمشا، یا حەمشاد، یامەشاد هەرسێکیان کورتەی(محەمەد شاد)ن و ئەمانە هیچیان بەپێی ئەو کتێبانەی کە لەبەردەستان، لەپیرانی ناودار نەبون لەکاتی بابا تاهیردا، بەڵێ حەمشادی دینەوەریی بوە لەزانایان و پیرانی گەورەی کورد، بەڵام بەپێی نوسینی شێخ عەبدولوەهابی شعرانی لە کتێبی(طبقاتی کبری) جەڵدی(١) لاپەرە(٨٧( چاپی میسر، لە ساڵی٢٩٧ھ دا کۆچی دوایی کردوە و بەپێی نوسینی ریسالەی(قوشەیریی)، لاپەرە(٢٥) چاپی میسر، لە ساڵی ٢٩٩ھ دا مردوە، کەواتە بەهەرحاڵ ئەم پیرە زۆر لە پێش بابا تاهیردا پیرێك بوبێ لە هەمەدان بە ناوی حەمشا، یا حەمشادەوە و ناوی نەنوسرابێ لە مێژوودا وەك هەزارانی تر.

٦. سورەی نەحل ئایەتی٩٢.

٧. ئەم چوارینەیە لە(گەنجینە)ی دڵزارا نیە.

٨. ئەم چوارینەیە لەلایەن مەلا محەمەدی غەزاییەوە، وەرگێڕاوەتە سەر سۆرانی.

٩. تەماشای دائرە المعارفی ئیسلامی، جلدی سێ، لاپەرە(٢٣٦) بکە.

١٠. تیرەی لوڕ لە لوڕستان دادەنیشن کە دەکەوێتە جەنوبی رۆژئاوای ئێران، بەم رەنگە رۆژئاوای لوڕستان لە خاکی ئێراندا لە بەرانبەری سنوری(مەندەلی)یەوە، دەستپێدەکات، تا بەرانبەری سنوری(عەمارە) هەر لە خاکی ئێران، سنوری رۆژهەلاتیشی، لە جەنوبی شاری(کرند)ەوە، دەستپێدەکات لە شیمال هەتا نزیك شاری(دیزفول) لە جەنوب.

چیای کەبیر کوھ- کە لە شیمالی رۆژئاوای ئێرانەو بۆ جەنوبی رۆژهەلات درێژ دەبێتەوە، ئەم قەڵەمڕەوە دەکات بە دوو بەشەوە:

١. بەشی رۆژهەلاتی(پێشکوھ)ە کە لوڕی ئەسڵی تێیدا دەژین.

٢. بەشی رۆژئاوای(پشتکوھ)ە کە فەیلییەکانی تیا دادەنیشن.

بەقسەی مینۆریسکی رووسی و ئۆسکارمانی ئەڵمانی شێوەی فەیلی لە کوردییەوە نزیکترە لە شێوەی لوڕی.

مینۆرسکی لە دائرە المعارفی ئیسلامی، بەرگی سێهەم، لاپەرە(٤١)دا دەڵێ لوڕ نەتەوەیەکن لە رۆژئاوای جەنوبی ئێران و دەبن بە چوار بەشەوە: مامەسەنی، کۆهگێلۆیی، بەختیاریی، لوڕی ئەسڵیی.

١١. تەماشای دائرە المعارف ئیسلامی- جلدی سێ- لاپەرە(٢٣٦) بکە.

١٢. تەماشای دائرە المعارفی ئیسلامی، جلدی سێ، لاپەرە(٢٣٧)بکە.

سەرچاوە: خاڵ، شێخ محەمەد، بابا تاهیری هەمەدانی مەشهور بەعوریان، لەچاپکراوەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد١٩٧٧.

# بابا تاهیری هەمەدانی لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلامیدا

ئەحمەد تاقانە لە تورکییەوە کردویەتی بە کوردی

بابا تاهیر عوریان شاعیرێکی کوردی سۆفییە، بە شێوە زمانێکی ناوچەیی شیعری نووسیوە بەپێی قسەی ڕەزا قولی خان(سەدەی١٩)، کە سەرچاوە دەستنیشان ناکات، بابا تاهیر لە سەردەمی فەرمانڕەواییی دەیلەمدا ژیاوەو لە(١٠١٠)ی ز(٤٠١)یشدا مردووە. پارچەیەك لە پارچە هەڵبەستەکانی بابا تاهیر زۆر مەتەڵ ئامێزە.

مو آن بحرم كه در ظرف آمدستم.

مو آن نقطة كه در حرف آمدستم.

بهر ألفى(ألف قد)ى برآيو.

(ألف قد)م كه در(ألف) آمدستم(١)

واتە: (من ئەو دەریا(بحر)ەم واکراوەتە ناو جامێکەوە، ئەو خاڵەم کە لەسەرپێتدا هەم، (الف) هەزار ساڵ جارێك، (الف قد) بەژن و بالاڕێکی وەکو پیتی الف پەیدا دەبێت، من ئەو(ئەلف قەد)ەم کە لەم هەزار(الف) ساڵەی دواییەدا هاتووم). مەهدی خان لە(JASB)دا(٢) بەپێی ژمارەی ئەبجەدی و بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش، ئەم پارچەیەی ڕوون کردووەتەوە. پیتەکانی دەستەواژەی(الف قد) بەپێی ژمارەی ئەبجەدی دەکاتە(٢٥). ئەمەش لەگەڵ ووشەی(بحر)ی عەرەبیدا کە بەرامبەرەکەی لە فارسیدا(دریا)یەو ووشەی(طاهر) کە ناوی شاعیر خۆیەتی هاوژمارەن. الف قد(٢١٥) لەگەڵ الف(١١١)دا کۆکەینەوە، دەکاتە(٣٢٦) کە لەگەڵ ووشەی(هزار)ی فارسیدا کە پیتەکانی بە(ها، زا، الف، را) دانرێت.. هاوژمارەن.. بەم شێوەیە دەستەواژەی(الف قد) کە دێتە سەر(الف)، ساڵی لە دایکبوونی بابا تاهیر(٣٢٦) پیشان دەدات و بەم جۆرە، دەشێ تا ساڵی(٤٠١) ژیابێت.

سەرەرای ئەم ڕوونکردنەوە هونەرمەندانەیە، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە، لەبارەی بابا تاهیردوە، تاکە سەرچاوەیەکمان بە دەستەوە بێت ئەو دەقەیە کە لە(راحە الصدور- ڕاحەتو سودوور)دایە(١٢٠٤=٦٠١)(GMS)(٣) لاپەڕە(٩٨) بەولاوە). نووسەری ئەم کتێبە، ئەوەی بیستووە کە کاتێك(طغرل- تۆغرول)ی سولتانی سەلجووقییەکان لە ساڵی(١٠٥٥-٤٤٧)دا چووەتە ناو هەمەدانەوە، بابا تاهیر گوتارێکی بەم شێوەیەی خوارەوە ئاراستەکردووە: (ئەی تورك، بەرامبەر بە موسوڵمانان نیازی چ جۆرە هەڵس و کەوتێکت هەیە؟)، هەروەها ئەوەشی بیستووە کە ئەم شێوە ئاخافتنەی بابا تاهیر کارێکی زۆری لە سوڵتان کردووە، ئەگەرچی ئەم دەقە، مردنی بابا تاهیر دەخاتە پاش ساڵی(٤٤٧)ەوە، ئەم سەرنجە دژایەتی لەگەڵ ئەوەدا پەیدا ناکات کە دەڵێ شاعیر لە سەردەمی کاکوێیە خزمەکانیدا ژیاوە کە لە سەردەمی دەیلەمیدا، واتە ئەمان و بوویهییەکان.. کە فەرمانڕەواییان لە هەمەداندا، تا گەشتەکەی ساڵی(٣٠٤)ی ئیبراهیم ئینال، بەردەوام بووە، بەڵام ئەو هەواڵانەی کە دەڵێت گوایە لە سێدارەدانی(عین القضاة- عەینولقوزات)(مردن-٥٣٣)ی هەمەدانیی دییوە هاوچەرخی(نصير الدين الطوسى- نەسیروددین ئەتووسی) بووە، دەستهەڵبەستن.

سەرچاوەکان جاروبار بابا تاهیر بە هەمەدانی(بڕوانە: پاریس، دەستنووسی عەرەبی، ژمارە١٩٠٣ سەر وەنجام وهی دی) و جار ناجاریش لوڕی(لووڕی)ی پێدەڵێن. بەکارهێنانی شێوەی لووڕی لە جیاتی لووڕ، پیاو دەخاتە بارێکی زۆر ئاڵۆزەوە. داخۆ ئەم واژەیە جگە لە پەروەردەبوون، بۆنەیەکی دیی پەیوەندیی بابا تاهیر بە لوڕستانەوە دەردەخات؟ گومان لەوەدا نییە لە، سەدەی یانزەمدا لە نێوان هەمەدان و لوڕستاندا باخ و دارستانی چڕ هەبووەو دەبێ ئەوەش لەبەرچاودا بێت کە شاعیر لە نێوان ئەم دوو شوێنەدا ژیاوە. لە شاری خوڕەم ئابادا گەڕەکێك بەناوی بابا تاهیرەوە هەیە(بڕوانە: ئەدمۆندس.G.J (٤)، حوزەیرانی١٩٢٢، ل٤٤٣).

پیشاندانی پەیوەندیی بابا تاهیر بە لوڕستانەوە، لە بیروباوەڕی(ئەهلی حەق)دا، واتا بەخشبە(بڕوانە خوارەوە)، لە چوارینەکانی بابا تاهیردا(بڕوانە- دیوان- ژمارە١٠٢،٢٠٠،٢٧٤)، ناوی چیای ئەڵوەند کە بەسەر هەمەداندا دەڕوانێت بەزۆری بەرچاودەکەوێت.

لە گۆڕی بابا تاهیر لە باکووری خواروی شارو، لە گەڕەکی بون بازاڕ(بن بازاڕ)دا ڕاستەقینە(بڕوانە خوارەوە) و گۆڕی میرزا عەلی نەقیی کەوسەری کۆتری) (سەدەی١٩)ش بە تەنیشت ئەم گۆڕەیە. گومەزو

ساختمانی سەرگۆڕە کە سادەو ساکارو شایانی خاوەنی نییە. لە(نزهە القلـــوب- نوزهـــەتولقولوب)دا (٧٤٠- ١٣٤٠) باســـی ئـــەم گـــۆڕەکراوە. بڕوانـــــە(GMS)- لاپـــــەڕە٧٥) بـــــۆ وێنەکـــــەی بڕوانـــــە: مێنورسکی**Materiaux William Jackson, avisit to The timb of tahir at hamadan(A Volume presented to E. G. Bambridge, 1922.**

(٥)، مۆسکۆ، ١٩١١- لاپەڕە١١٥ ولاپەڕە(٢٥٧-٢٦٠)(٦) ئەو چیرۆکانەی کە لـە(مازەنـدەران)دا دەبیسـترێن و پەیوەنـدیی بابـا تاهیربـەو ناوچـەیەوە دەردەخەن ڕاستنین. دوورنیە ئەمانە لەلایـەن ئـەو(لەکانـەوە) هێنرابنـە ئەوێ کـە لـە لوڕستانە و کۆچیان کـردووە. بەتایبـەتی هـەموو کۆچـەرە ئێرانییەکان بە هاوولاتی خۆیان دادەنێن.

### زمانی( شێوە زمانی ) بابا تاهیر:

بێگومان شێوە زمانەکەی دەبێت ئـەو شـێوەیە پیشان بـدات کـە لـەم لایـەی ئێرانـەدا ماوەتـەوە. نزیکیـی زۆری ئـەم شـێوەیە لـە فارسـییەوەو لەبەر ئەوەی کە ئەوانەی ئەو دێڕانەی کە دەماودەم ماونەتـەوە دووبـارە دەکەنەوە، کەسانێکی جۆراوجـۆرن و لەبـەر ئـەوەش کـە ئـەو دێڕانـەیان پتروا لێکردووە بۆیان ئاسانتربێت، چەسپاندن و سەلماندنی شیعرەکان بـە شێوە ڕاستەڤینەکەی خۆی زۆرکەم لە توانادایە.

هەروەها ئەوەش دەگونجێت کە موریدە سادەکانی بابـا تـاهیر بییریـان لـــەوە کردبێتـــەوەو وبســـتبیتیان لاســـایی بکەنـــەوە تەنانـــەت لـــەم سـەردەمەماندا دیـانێکی کـورد، دانیبـەوەداناوە کـە لـەپێناوی گەیانـدنی هەندێك هەواڵ بە- ئەهلی حس- بە(شێوەی گۆران)ی زۆر دوور لە شـێوە زمانەکـەی خـۆی شـیعری دانـاوە(د. سـەعید خـان- **MW** (٧)- کـانوونی ١٩٢٧، لاپـەڕە/٤) ئـەمڕۆ لـە ناوچـەی نێـوان هەمـەدان و خـوڕەم ئابـاددا چەند شێوە زمانێك هەیە. بەڵام ئەوەی بابا تـاهیر بـەهیچ یەکێکیانـەوە نابەسترێت، کەچی پەیوەندیی لەگەڵ هەمووشیاندا هەیە. نزیکیـی دەنـێ ئەمڕۆی چوارینەکانی بابا تاهیر لە زانی ئەدەبیی فارسی گفتوگۆی ناوێ، لەلایـــەکی دیکـــەوە جیـــاوازیی وەکـــوو: نـــام، نـــووم(نـــاو)، دەســـتەم، دەســـتوم(دەســـتم)، ڕەفتـــەم، ڕەفتـــووم(ڕۆیشـــتم)، دوور، دیـــر(دوور) (بڕوانە**XIV** (١٤) و**Huart** دیوان، ژمارە(٨٢).

### لەتایبەتییەکانی شێوەی لوڕیی:

**ڕەگی وەکوو: ڤاج(قسەکردن)، کار(کردن)یش، تایبەتییە بە کوردی و شێوە ناوەندییەکان. ووشەی وەکوو: (مـی- کـار- وو) (دەکـات)، (ئـای- وو) (دێت) یش ئـەو شـێوە(گۆران) یـەمان بییردەخاتـەوە کـە لـە خۆراواتردا قسـەی پێـدەکرێت. هـەروەها هەنـدێك تایبەتییـەتی دیکـەش هەیـە، وەکوو(دارەم، دیروم) لە کاروون(شیرازو دەوربەری)دا دەبینرێت.**

**چـوارینەکان لـە دەقـی ئەمڕۆیانـدا پشـتگیریی بەیەکداچـوون و ئالۆزبوونی چەند شێوەیەکمان لە لێکۆڵینەوە(Handak) بۆ دەکەن.**

لـــە بـــارەی زمـــانی بابـــا تـــاهیرەوە ئـــەو زاراوەیـــەی کـــە لەلایـەن(**Huart**)ەوە(١٨٨٥) پێشنیارکراوە کـە بـە پەهلـەویی ئیسـلامی ناوبنرێت لە جیهانی زانستدا پشتی پێ نەبەستراوە.

کێشـــی چـــوارینەکانی بابـــا تـــاهیر(هـــەروەها غەزەلەکانیشـــی)، دەڤاودەق(هەزەجی موسەددەسی مـەحزووف)ە(ب - - -/ ب - - -/ ب - - -) بەم هۆیەوە تازەیەتیی مۆرکی پارچەکانی بابا تـاهیر ئـەوە دەگونجێنێت کە لـە جیـاتی(روبـاعی- چوارین) تایبەتـە بەکێشـی(هـەزەجی مـەقفوولی مەقسوور)ە (- - ب ب/ - - ب ب/ - - ب/ -). هەندێك لەو چوارینانەی کـە دەدرێنە پاڵ بابا تاهیرەوە گومان لێکراو دێتە بەرچاو لەلایـەکی دییـەوە ئەو کێشانەی کە بەکاری هێناون لە گۆرانیی میللیدا ناسراون.

**Yazlka. Pers. Gramm. (Korsch)±**(مـیرزا جەعفـەر

(٨) مۆسکۆ، ١٩٠١، لەلاپەڕە/ ٣٠٨.

### شاعیریەتیی:

تا ساڵی١٩٢٧ تەنیا ئـەو پارچـەکەمانە زانرابـوون کـە لـە(ئـەنتۆلۆژی) کۆمەڵەو کەشکۆڵەکانی سەدەی١٨ و١٩دا بوون.

لـــە ئـــەنجامی لێکۆڵینـــەوەکانی(**Huart**)دا لـــە ١٨٨٥دا٥٩١ پارچـــەو لە١٩٠٨دا ٢٨ پارچەی دیو غەزەلێکی دەست کەوتبوو. هاروون) تـەنیا سـێ پارچـەی تـازەی دۆزیبـووەوە(هەرچـۆنێك بێـت ئەمانـە زۆر گومانیـان لێدەکرێت). (لەزنسکی) کە سوودی لـە دەستنووسـەکانی بـەرلین بینیـوە، (٨٠) پارچـە(جگـە لەوانـەی هـووارت) و غەزەلێکیشـی گۆڕییـەوە لـە ئەنجامـدا بڵاوکـەرەوەی گۆڤـاری(ئەرمـەغان)ی فارسـی، حوسێن وەحیـد دەســـتگەردیی ئەســـفەهانی لـــە(١٣٠٦- ١٩٢٧)دا لـــە تارانـــدا دیـــوانێکی بڵاوکردووتـــەوە کـــە ٢٩٦ دووبـــەیتی و ٤ غـــەزەلی گرتووەتـــە خۆیـــەوە، بڵاوکـەرەوە وەکـوو پاشـکۆ٦٢ دووبـەیتی- کـە لـەگۆڤاری جۆراوجـۆرەوە بەدەسـتی خسـتوون و ئـەو٣ چـوارینەی کـە(ئـەلن) زیـادی کـردوون، بڵاوکردووەتەوە.

پارچەکانی ناودیوان، بـەپێی(سـەروا- قافیـە)و بـەپێی ڕیـزی ئـەلف و بێ ڕیزکراون. بەداخەوە بڵاوکەرەوە لەبارەی ئەو دەستنووسەی- بناغـەی لە چاپدانی دیوانەکەیە هیچ جۆرە زانیارییەکی نەداوە بەدەستەوە.

لەزوربـەی ئـەو پارچـە تازانـەدا نـاوی بابـا تـاهیرو. چـیای ئەڵوەنـدو مەیمەند(؟)و هی دیکە زۆر ناوبراوەو لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم ناوبردنانە لـەتام دەرچـووە، کەسـایەتیی ناسـراوی بابـا تـاهیر پـتر دەچەسـپێنێت، سەرەڕای هەموار نەبوونی لاساییکردنەوەی دەربڕینی شـێوەی ناوچـەیی زمانی بابا تاهیر، ئەم پارچانە بۆ سەلماندن بە بەڵگە دادەنرێت.

**مەسـەلەی دروسـتی و نادروسـتیی پارچـەکانی بابـا تـاهیر، هـەر بـەو شـێوەیەی کـە لـەبارەی عومـەری خەیامـەوە دەکرێـت.. بێگومـان هـەر دەبێتـە بابـەتی لێکولینـەوە. بـەپێی گوتـەی ژۆکۆڤسکی، دیـوانی(مـەلا محەمەدی سۆفیی مازەنـدەرانی)ش (نزیکـەی سـەدەی ١١) پارچـە شـیعری بابـا تـاهیری تێدایـە. (محەمـەد شـاتر)ی شـاعیری هەمـەدانی خـۆی بـە خاوەنی گەلێك پارچەی کوردیی(پەهلەوی) دادەنا کە گوایە دەدرێتە پاڵ بابا تاهیرەوە بڕوانە- دیوان- لاپەڕە/٢١.**

بابەت لەلای بابا تاهیر لە دەرەتانێکی تەسکدایە، بەلام شاعیر پێناسەیەکی کەسایەتیی هەیە. ئەگەر شیکردنەوەی ئەو٥٩ پارچەیەی کە لەلایەن(هورارت)ەوە بلاوکراوەتەوبکەین بە نموونەو پیشانی بدەین. وەکو هەرکاتێك، کێشانی دنیاییدا گەلێك زەحمەتە. (٣٤) پارچە، ڕێك بەسەرئەم دووجۆرە شیعرەی ستراناميزە(لیریك)دا دابەش دەکرێت دووپارچەی لە سوپاس و پەسند گوێی(حەمدوسەنا) بۆخودا پێکهاتووە... ئەوانەی دیکە پتر خۆیی و کەسایەتی ئامێزە باسی ئەودەربەدەری و دەروێشیی قەلەندەرانەیان بەسەربردنەی بابا تاهیر دەکات و ئەوە دەکێرێتەوە کە خاکی کردووەتە سەرین و نووستووەو هەمیشە لەناو ناارامی و هەژاندا بووە. (ژمارە٦/, ٢٨/١٤/٧) و ئەندێشەو پەژارە یەخەی بەرنادەن. ئەوەی لە دڵیدا پشکووتووە تەنیا(گوڵی پرسە)یەو، تەنانەت جوانییەکانی بەهاریش ناتوانن شادی بکەن. (٢٤، ٣٥، ٤٧، ٥٤). بابا تاهیر بە فەلسەفەی سۆفییانەوە بەندە. دان بە تاوانەکانیدا دەنێت و بۆ لێخۆشبوون دەپاڕێتەوە ئەڤینداری نەمانە، تاکە چارەسازی نائارامی لە نەماندا دەبینێت، (١، ١٢، ٤٥، ٥٠، ٥٨). بەتایبەتی ئەم باسکردنە مرۆڤانەیە لەلای بابا تاهیردەبینرێت. پێی ناکرێت بە ئاسانی چاوو دڵی لە جیهان جودا بکاتەوە، دڵی یاخی بووی لە سووتاندایەو ساتێك وازی لێ ناهێنێت، شاعیر وەکوو شێت هاوار دەکات، مەگەر شێرو پڵنگی ئەی دڵ بموودایم بەجەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ ئەگەر دەستوم رەسەد خوونت بریجوم بوینەم تا چەرەنگی ئەی دل ئەی دل(٩، ٨، ٩، ٢٦، ٣٦، ٤٢).

**پێناسەی ئەدەبیی بابا تاهیر:**

لەگەڵ ئەوەی عومەری خەیام (مردنی٥١٧ك/ ١١٢٣ز) دژایەتیی گەورە پیشاندەدات. وەکوو ئەوەی بابا تاهیر بەرامبەر ئەو بەختپەرستییە(Hedonizm) و ئەو گۆڕانکارییەی کە لەلای عومەری خەیامدا بەهۆی مردنەوە ڕوودەدات، بێجم ناوەستێت.. عومەری خەیام لە کێبەرکێی سۆفییانەی بابا تاهیر بێبەش دەمێنێت. ئەو تازەییەی هەستییەتی کە هێشتا نەکەوتووەتە ناو دیلییەتیی نەریتی سۆفیگەرییەوەو، ئەو ساکارییەی لە ئەندێشەیدا هەیە ئەو ڕوونییەی زمانیەتی کە تاموبۆی شارەکەیی پاراستووە. فیتزجیرالدێکی نوێ بابا تاهیر دەگاتە ڕەقیبێکی شایانی عومەری خەیام(١٠).

**سۆفییەتیی:**

ئەو دەروێشە ئێرانییانەی کە ژۆکۆڤسکی لەبارەی بابا تاهیرەوە دیدەنیی کردوون دەڵێن: (بابا تاهیر) خاوەنی چەند نووسراوێکی میتافیزیقییشە. (بڕوانە- ڕەزا قولی خان)، ئەم ئەو لێکۆڵینەوانەی لەبارەی پارچە شیعرەکانی بابا تاهیرەوکراون و لە ئۆکسفۆردو پاریس(Nat ,bibl)دا هەیە لە ئەوروپا دوای ئەو تێبینیانەی(Ethe)و (بلۆنێت)ەوە زانراوە، سەرپاکی (ئەلکەلیماتولقیسار- گوتە کورتەکان) لە بلاوکراوەی ئەرمەغاندا بلاوکراوەتەوە. ئەم نووسراوەو بەپێی ئەو بابەتانەی خوارەوە کراوە بە ٢٣ بەشەوەو لە٣٦٨ پارچەی کورت پێکهاتووە: علیم و مەعریفەت، ئیلهام و فیراسەت، عەقل و نەفس، دونیاو عوقەبا، سەماع و زیکر، ئیخلاس و ئیعتیکاف، .. هتد.

چەند نموونەیەك لەم پارچە کورتانە: ژمارە/٨٦- عیلمی حەقیقی، ئەو پێشبینییەیە کە لە پاش بەدەستهێنانی زانینی(یەقین)ەوە دێت، ژ/٩٦- وەجد، بزربوونی زانستی شتەهەبووەکان و بوونی شتە بزرکراوەکانە. ژ/٣٦٨ ئەوەی ئەو کارەساتە دەبینێت کە لە سوداو دێت، بێ جوولەو بێ توانا دەبێت ژ/١٠٠ ئەوەی کە نەزانێ کوشتوویەتی هەرگیز نامرێت.

برەوسەندنی ئەلکەلیماتولقیسار- لەناو سۆفییاندا ڕوون و ئاشکرایە. بلاوکەرەوەی ئێرانی، ئەم لێکدانەوانەی خوارەوەی ئەم کتێبە باس دەکات: ئەو لێکدانەوە عەرەبییەی کە دەدرێتە پاڵ(عین القضاة الهمدانی) (مردن-٥٣٣، لە ئەفسانەکاندا بەزۆری لەگەڵ بابا تاهیردا باس دەکرێت). لێکدانەوەیەکی دیکەی عەرەبی کە لەلایەن نووسەرێکی نەناسراوەوە نووسراوە. لێکدانەوە عەرەبی و فارسییەکان مەلا سوڵتان عەلی کوونابادی. (لێکدانەوەی فارسی، دەوروبەری ساڵی١٣٢٦= ١٩٠٦ چاپکراوە، بەلام تارادەیەکی زۆر زۆر دەگمەنە)، بلاوکەرەوەی ئەرمەغان بە ئاواتەوەیە کە ڕۆژێك ئەم نووسراوە بە لێکدانەوەیەکەوە بلاوبکاتەوە.

ئەو دەستنووسەی کە لە ژێر ژمارەی١٩٠٢دایەو لە بیبیوگرافیای(Nat)دا پارێزراوە، هەشت بەشی ڕوونووسێکی کورتکراوەی پارچە کورتەکانی بابا تاهیر(لاپەڕە-١٠٠ب، ١٠٥ب) و لێدانەوەکانی(لاپەڕە-١٧٤أ- ١١٠أ) دەگرێتەخۆیەوە. ناوی ئەم ڕوونووسە الفتوحات الربانية في الاشارات الهندانية) یە. هەر لەم دەستنووسەوە تێدەگەین کە ئەم ڕوونووسە بە دەستخەتی(جانی بەگ ئەلعەزیزی)یەیە، کە نووسەری لێکدانەوەکەیەو لە شەوالی٨٨٩دا دەستی بە نووسینەوەی کردووە، لە(٨٥٢)وە دەست بەنووسینی کراوە. ئەگەرچی ئەو دەستنووسەی کە(ئیشارات)ی تێدایە لە مەککەدا کەوتبێتە ناو بیری زەمزەمەوە، هەر چۆنێك بێت ڕزگارکراوەتەوە لەبەر قوولیی کرۆك(متن)و زەحمەتبوونی تێگەیشتنی، زانایان دەستیان لە لێکدانەوەی هەلگرتووەو ڕاسپاردنی لێکدانەوەیان بە ئەبولبەقا پێشنیارکردووە. پاشان ئەبولبەقا ئەم کارەی داوەتە لای جانی بەگ. لێکدانەوە کە هەر وشەیەکی کرۆکی پارچە کورتەکانی بابا تاهیری یەکەیەکە لێکداوەتەوە.

**وەلییەتی:**

هەر وەکوو لە بارەی گەلێ شاعیری سۆفیی وەکوو(عەتارو، جەلالەددینی ڕۆمی و، حافز)ەوە گوتراوە لە بارەی ژیان و کەراماتی بابا تاهیریشەوە کەلێك کارپەسندی(مناقب) هەیە. وەکوو باسکراوە بابا تاهیر ڕۆژێك لە قوتابییانی مەدرەسەی هەمەدان دەپرسێت، بۆ بەدەست هێنانی زانست، پێویست بەچی دەکات بکرێت؟ قوتابییەکان بۆ پێڕابواردن پێشنیار دەکەن کە شەوێکی زستان لەناو بەفراوی حەوزەکەدا بەسەرببات. بابا تاهیر ئەم پێشنیارە هەر وەکوو خۆی جێبەجێدەکات. ڕۆژی دوایی کە بەتیشکی زانست ڕووناکبوونەوەی خۆی

دەبێنێـــت هاواردەكـــات(أمســـيت كرديـــا وأصـــبحت عربيـــا..(١١) ئـــەم كارپەســـــندی(منقبـــــە)یـــــە لەلایـــــەن ژوكوڤســـكی لـــە تارانـــــدا و لەلایەن(بووشیر)یشەوە كە ئەو زاتەیە هاڕوون ئەلن سوودی لێوەرگرتووە چەسپێنراوە لە هەمەدانیشدا زۆر بەناوبانگە(بڕوانە. دیوان. پێشەكی، ل ١٧ و دەستنووسەكانی. هەمـەدان.) ئەگەرچی ئـەم ڕستە عەرەبییـە لـە پێشـەكیی فـەتوای جەلالـەددینی ڕۆمیشـدا هەیـە، لەوێـدا دەدرێتـە پـاڵ بـــاپیری ئـــیبن ئـــەخی تـــوركی ڕوومیـــەیی)ی (ســـۆفی؟) لەچـــی لـــە (نەفەحاتولئونس)ی جامیدا(بلاْوكەرەوە ± ناسسولێش، ل/٣٦٢ بەدواوە).

ئـەم ڕستەیە دەدرێتـە پـاڵ ئـەبو عەبـدوڵلای لـەلباب وونـی بـەپێی كارپەســـندییە ئایینییـــەكانی دیكـــە، جارێكیـــان شـــیكاری پرســـیارێكی لەبارەی(عیلمی هەیئە)وە كە لێیكراوە بەنووكی پەنجەی پێی كێشاوەو... تـــاد. (ژۆكۆڤســـكی، هـــاڕوون ئـــەلن، لەزینســـكی، پێشـــەكیی دیـــوان و دەستنوسەكانی هووارت).

پێشـتریش گۆبینیـۆ(ل/ ٣٤٤، **Trois ans en Asie, Paris, 1851**)(١٢) ئاگـاداری ئـەوەبووە كە سـەر بـە ڕێبـازی ئـەهلی حـەق لـەو بڕوایـەدان كـە(شـیعری سـۆفییە بەناوبانگـەكان و بەتایبـەتی ئەوانـەی شـیعریان بـە شـێوەی لـوڕی نووسـراوەتەوە بابـا تـاهیرو بیبـی فاتمـەی خوشكی(... تاد)ی ئەوانەی وا بە شێوەیەكی سەرسا لاسایی دەكرێنـەوە، یەكجار پەسندبكەن و ناویان بەرزبكەنەوە).

دۆزینـەوەی(سـەرەنجام- سـەرئەنجام)ی كتێبـی ڕێبـازی ئـەهلی حـەق، ئـەو جێگەیـەی بابـا تـاهیر بیروبـاوەڕی ئـەم ڕێبـازەدا بەشـێوەیەكی سەلێنراو خستووەتە سنووری تواناوە. ئـەهلی حـەق، بڕوایان بەحـەوت دیاردەی(شێوەی- یان- دۆنای دۆن)ی خودایەتی هەیە كە ئەمانـەن. (١٣) یەكـــەمیان، ئـــەوەی خوداوەنـــدكارە، كـــە بـــەر لـــە هەمیشـــەیی (ئەبەدییـــەت)ەوەیـــە، دووەمیـــان، ئـــەوەی عەلییـــە، ســـێیەمیان، ئەوەی(خۆشین)ە، چوارەمیان، ئەوەكەی(سوڵتان ئیسحاق)ە هـەر یـەكێك لەم دیاردانـە، هەموو، بۆ فرمانێك خراونەتـەكار، لەگـەڵ چوار پـەریی (مەلـــەك)دا پەیوەنـــدیی هەیـــە. كەواتـــە، بابـــا تـــاهیر بەپەرییـــەك لەپەرییەكانی بابا خۆشین و شێوەكەی عزرائیل و نوسەر دادەنرێت. ئەو قۆناغـــە ســـۆفییانەیەی كـــە بەرامبـــەر بـــەخولی بابـــا خوشـــین دەبێتەوە(مەعریفەت)ە، ڕووداوەكانی ئەم خولە لە لوڕستان و هەمەداندا بە ئەنجام دەگەن.

كتێبی(سەرەنجام)، سـەردانی شـای جیهان لـە تەكیـەی بابا تـاهیر لـە هەمەداندا دەگێڕێتەوە. مەبەست لە شای جیهان بابا خوشینە، بەڵام ئەم كارپەســندییە، وەكــوو لــە سرووشــتی گێڕانــەوەی ئەوباســەی(طغــرل- توغرول)ەوە وەرگیرابێت وایە كە لە ڕاحەتوسدووردا باس كـراوە. بابا تاهیر و فاتمە لێرە(گێرانەوەیەكی لاواز) كە لـە تیرەی بەرەشاهیی(سەر بە گۆران؟) بووەو لە خزمەتی بابا تاهیردا بووە، بەچێشتی(چار- یـەك) كە لە برنج لێنراوە هەموو سوپای شا/ تێردەكەن. ئەگەرچی شا، هەوڵی ئەوەی داوە كە دڵی بابا تاهیر بە گەنجینەی هـەموو جیهان كـێش بكات. كەچی ئەم تەنها ئارەزووی لە جوانیی شا بووە.

فاتمە دەیەوێت شوێنی شا بكـەوێت، سـەری دەنێتـە سـەرڕانی و گیـان دەدات. شـا لەبـەر لەناوچـوونی فاتمـە، دڵخۆشـیی بابـا تـاهیر دەداتـەوەو بەڵێنیشـی پێـدەدا كـە وەكـوو مـەجنوون و لـەیلا لـە ڕۆژی حەشـردا بـە فاتمەی شاد بكات.

سێ پارچە شیعری ناتەواو بەڵام نزیك لە شێوە نووسینی بابا تـاهیر، ئاخنراوەتـە نـاو كرۆكـی نووسـینەكەوە(بڕوانـە. مینۆرسـكی. ماتـەریالی، لاپـــەڕە٢٩٥-١٣، ٩٩-١٠٣، لەزینســـكی، لـــە لاپـــەڕە(١٨-٢٥)دا لـــەم زانیارییانـــە سـوودی وەرگرتـووە). لـە كرۆكەنووسـیندا فاتمـە لـیرەی بابـەتی باسمـان بەتەك بابا تاهیرەوە نێژراوە، بەپێی قسەی پاسەوانەكان) لای گـۆڕی بابـا تاهیر و ئەو دەوروبـەرەدا فاتمەیـەكی دیكـەش نێـژراوەو پێویست دەكـات كە ئەم دووانـە تێكـەڵی یـەك نـەكرێن. گـابینیۆ(ا. ێ. و جاكسـن) نـاوی خوشـكی بابـا تـاهیر دەهێـنن كـە نـاوی بیبـی فاتمـە، یـان فاتمـە لەیلایـە، ئازادی هەمەدانی(دیوان- لاپەڕە١٦-٢١). باسی كوڕی دایەن(شـیردایكی) بابـا تاهیر دەكات و پەیوەندیی نێوان بابـا تـاهیر و فاتمـە دەكـات و پەیوەنـدیی نێـوان بابـا تـاهیر و فاتمـە بـە شـێوەیەكی(شـارەكییانە) ڕوون دەكاتـەوەو گیروگرفتی دیكە دێنێتەگۆڕ٦..

ئەوپارچـەی كـە لـە سـەرەتای گوتـاردا بـاس كـرا(ئـەلف ئـەلف قـەد) هەندێك لەتاسە بەرزەكانی بابا تاهیر ڕەنگ دەداتەوە.

ئـــەم ووتـــارە لەلاپـــەڕە(١٦٦-١٧٠)ی بـــەرگی (٢)ی (ئەنســـكلۆپیدیای ئیسلامی)ی چاپی تـوركیی(ساڵی١٩٦١)ەوە گۆڕاوەتـە سـەر كـوردی. چـەند ڕوون كردنەوەیەكی وەرگێڕ:

١ـ ئەم چوارینە لە دەقە توركییەكەدا نییە.

٢ـ گۆڤارو ڕووداوەكانی كۆمەڵەی ئاسیایی لە بەنگالدا.

٣ـ زنجیرە یادگارییەكانی جیب.

٤ـ گۆڤاری جوگرافیایی.

٥ـ ئەم ووشە بیانییەم بۆ ساغ نەبووەوە كەچییە.

٦ـــ ولیـــەم جاكســـن. ســـەردانێك لـــە ئارامگـــای بابـــا تـــاهیر لـــە هەمەدان(بەشە نووسینێكە پێشكەشی- ئیدوارد گرانڤیل بـراون- كـراوە)، كامبردج، ١٩٢٢.

٧ـ جیهانی موسڵمان.

٨ـ ئەم ووشانەم بۆ ساغ نەبووەوە.

٩ـ ئەم چوارینەش لە دەقە توركییەكەدا نییە.

١٠ـ فیتز جیرالد- ئەو شاعیرە بەناوبانگەیە كە شیعرەكانی خـەیامی كردووە بە ئینگلیزی و بە خۆراوای ناساندووە.

١١ـ واتە: كە ئێوارەم كردەوە كوردبووم و لـە زانستی ئیسلامەتی كە بـە عەرەبیـە هیچـم نـەدەزانی، كـە ڕۆژم كـردەوە بوومـە عـەرەبێك كـە زانستی ئایینی عەرەبیی ئیسلامی فێربووم.

١٢ـ ئەم ووشانەشم بۆ ساغ نەبووەوە.

١٣ـ واتە: چوونە پێستی شتی نیكەوە.

# هەڵبژاردەیەك لە دوو بەیتییەكانی (بابا تاهیری عوریان)

قلم بتراشم از هر استخوانم — مرکب گیرم از خون رگانم
بگیرم کاغذی از پرده‌ی دل — نویسم بهر یار مهربانم

موآن رندم که عصیان پیشه‌دیرم — به‌دستی جام و دستی شیشه دیرم
اگر تو بیگناهی رو ملك شو — من از حواو آدم ریشه دیرم

مو آن رندم که پا از سر ندونم — سراپایی به جز دلبر ندونم
دلارامی کز او گیرد دل آرام — به‌غیر از ساقی کوثر ندونم

چه خوش بی وصلت ای مه امشبك — بی‌مرا وصل تو آرام دلك بی
ز مهرت ای مه شیرین چالاك — مدامم دست حسرت بر سرك بی

نسیمی کز بن آن کاکل آیو — مرا خوش ترز بوی سنبل آیو
چو شو گیرم خیالش در آغوش — سحر از بسترم بوی گل آیو

خوشا روزی که دیدار تو وینم — گل و سنبل ز رخسار تو چینم
بیا بنشین که تا وینم شو و روز — جمال ات ای نگار نازنینم

اگر جسمم بسوزی، سوته خواهم — اگر چشمم بدوزی، دوته خواهم
اگر باغ ام بری تا گل بچینم — گلی همرنگ و همبوی ته خواهم

جدا از رویت ای ماه دل افروز — نه‌روز از شو شناسم نه‌شو از روز
وصالت گر مرا گردد میسر — همه روزم شود چون عید نوروز

شوان استارگان یك یك شمارم — به راه ات تا سحردر انتظارم
پس از نیمه شوان که تو نیایی — ز دیده اشك چون باران ببارم

دل عاشق به پیغامی بسازد — خمار آلوده با جامی بسازد
مرا کیفیت چشم تو کافی است — ریاضت کش به بادامی بسازد

بود درد مو و درمانم از دوست — بود وصل مو و هجرانم از دوست
اگر قصابم از تن واکره پوست — جدا هرگز نگردد جانم از دوست

بمیرم تا ته‌چشم تر نبینی — شرار آه پر آذر نبینی
چنانم در آتش عشق ات بسوجد — که از مو مشت خاکستر نبینی

خوش آن ساعت که یار از در درآیو — شو هجران و روزغم سرآیو
ز دل بیرون کنم جان را به صد شوق — همی واجم که جایش دلبر آیو

دو چشمان ات پیاله‌ی پر ز می بی — خراج ابروان ات مُلك ری بی
همی وعده کری امروز و فردا — نمی دونم که فردای تو کی بی

سر راهت نشینم تا بیایی — در شادی به‌روی ما گشایی
شود روزی به روز مونشینی — که تا وینی چه سخته‌بی وفایی



گر آن نامهربانم مهربان بی    چرا از دیدگانم خون روا بی
اگر دلبر بەمو دلدار می بو    چرا درتن مرانه دل نەجان بی
بەخنجر گر برآرند دیدگانم    در اتش گر بسوزند استخوانم
اگر بر ناخنانم نی بکوبند    نگیرم دل ز یار مهربانم
دو زلفانت گرم تار ربابم    چەمی خواهی از این دل خرابم
تەکەبا موسر یاری نداری    چراهر نیمه شو آیی بەخوابم
دلا از دست تنهایی بەجانم    ز آه و نالەی خود در فغانم
شبان تار از درد جدایی    کند فریاد مغز استخوانم
فلك زار و نزارم کردی آخر    جدا از عذارم کردی آخر
میان تختەی نرد محبت    شش و پنجی به کارم کردی آخر
سه درد آمو به جانم هر سه یك بار    غریبی و اسیری و غم یار
غریبی و اسیری چارەدیره    غم یار و غم یار و غم یار
ز کشت خاطرم جز غم نرویی    زباغ ام جز گل ماتم نرویی
ز صحرای دل بی حاصل مو    گیاه نا امیدی هم نرویی
غمم غم بیو همراز دلم غم    غمم همصحبت و همراز و همدم
غم ات مهله که موتنها نشینم    مریزا، بارك الله، مرحبا غم
درخت غم به جانم کرده ریشه    بەدرگاه خدا نالم همیشه
رفیقان قدر یکدیگر بدانید    اجل سنگ است و آدم مثل شیشه
خوشا آنان که هر از برندانند    نه حرفی وانویسند و نه خوانند
چو مجنون سر نهند اندر بیابان    از این گوگل روند آهو چرانند
شب تاریك و سنگستان مومست    قدح از دست مو افتاد و نشکست
نگهدارنده اش نیکو نگه داشت    وگرنه صد قدح نفتاده بشکست
سرم چون گوی در میدان بگردد    دلم از عهد و پیمان برنگردد
اگر دوران به نااهلان بمانه    نشینم تا این که این دوران بگردد
یکی برزیگری نالان در این دشت    بەخون دیدگان آلاله می کشت
همی کشت وهمی گفت دریغا    ببایدکشت و هشت ورفت ازاین دشت
به قبرستان گذر کردم صباحی    شنیدم ناله و افغان و آهی
شنیدم کله ای با خاك می گفت    که این دنیا نمی ارزد به کاهی
به قبرستان گذر کردم کم و بیش    بدیدم قبر دولتمند و درویش
نه درویش بی کفن در خاك رفته    نه دولتمند برده یك کفن بیش
اگر زرین کلاهی، عاقبت هیچ    اگر خود پادشاهی، عاقبت هیچ
اگر ملك سلیمان ات ببخشند    در آخر خاك راهی، عاقبت هیچ
دلا اصلا نترسی از ره دور    دلا اصلا نترسی از ته گور
دلا اصلانمی ترسی که روزی    شوی بنگاه مار و لانه مور
از آن روزی کەمارا آفریدی    بەغیر از معصیت چیزی ندیدی
خداوندا به حق هشت و چارت    ز ما بگذر، شتر دیدی ندیدی
بیا تا دست از این عالم برداریم    بیا تا پای دل از گل برآریم
بیا تا بردباری پیشه سازیم    بیا تا تخم نکویی بکاریم
بەصحرا بنگرم، صحرا تەوینم    به دریا بنگرم، دریا تەوینم
بەهر جا بنگرم کوه و در و دشت    نشان از قامت رعنا تەوینم



سەرچاوە: لەم سایتە فارسیەوە وەرگیراوە:
www.iranian.com/july96/arts/babatahir.

# شەنوكەوێكی هەندێ دوو بەیتی بابا تاهیری هەمەدانی

سدیق بۆرەكەیی

بابا تاهیری هەمەدانی كە بەیەكێ لە هۆنەرە گەورەكانی كورد دێتە ژمار، بەپێی ئەو بەڵگانەی كە لە دەستدایە لە سەدەی پێنجی كۆچیدا ژیاوە. لە بارەی چۆنیەتی ژیان و شوێنەواری بابا تاهیرەوە گەلێ كەس دواوەو هەر كام بە گوێرەی سەلیقەی خۆی شتێكی نووسیوەو لە هۆنراوەكانی كۆڵیوەتەوە.

ڕەزا قولی خانی هیدایەت كە لە ساڵی١٢٨٨ای كۆچیدا كۆچی دوایی كردووە، لە پەڕاوی (مجمع الفصحاء)دا ئەڵێ:"بابا تاهیری هەمەدانی كە بە(عوریان) بە ناوبانگە یەكێكە لە خواناسانی هەرە گەورەی خول و زەمانی خۆی، هەر چەندە گەلێ لە زانایان لایان وایە كە بابا هاوچەرخی سەلجووقییەكان بووە بەڵام وا نیەو لە ڕاستیدا لە سەردەمی دەیلەمییەكانا ژیاوەو لە ساڵی ٤١٥ی كۆچیدا ماڵ ئاوایی لە جیهان خواستووە.

میرزا مەهدی خانی كەوكەبیش وتارێكی لە بارەی ژیانی بابا تاهیر لە گۆڤاری كۆمەڵەی ئاسیایی لە بەنگاڵدا لە ساڵی ١٩٥٤ی زاین بڵاوكردووتەوە وئەڵێ: مێژووی لە دایكبوونی بابا تاهیر بەپێی ئەم دووبەیتیەی خۆیە لە ٣٢٤ی كۆچیدا بووەو لە ساڵی٤٥١ی كۆچیشدا مردووە. دووبەیتی‌یەكەی ئەمەیە كە ئەڵێ:

مۆ ئان بەحروم ك دەر ظەرف ئامەدوستوم
مۆ ئان نوقطە ك دەر حەرف ئامەدوستوم
بە هەر ئەلفی ئەلف قەدی بەر ئایۆ
ئەلف قەدوم ك دەر ئەلف ئامەدوستوم

واتە: من وەكوو ئەو زریەو دەریایەم كە لە پیاڵەیێكدا دەركەوتووم، من ئەو نوختەو خاڵەم كە لەسەری پیتێكدا پەیدابووم، لە پایان و دوایی هەر هەزار ساڵدا ئەلف ئەندامێ دەرئەكەوێ، من ئەو ئەلف، ئەندام و باڵاراستەی وەك ئەلفەم كە لە ئەلف یا هەزارەدا هاتوومەتە جیهانەوە.

جا میرزا مەهدی خان ئەم دووبەیتییەی لەسەر ژمارەی ئەبجەد لێك داوەتەوەو ئەڵێ:"وشەی(ئەلف قەد) و(بەحر) هەر یەكێكیان بە ژمارەی ئەبجەد ئەكا(٢١٥). ئینجا ئەگەر ژمارەی(ئەلف قەد) كە٢١٥یە لەگەڵ ژمارەی(ئەلف)دا كە ١١یە بخرێتە سەریەك ژمارەی٣٢٤ پەیدائەبێ و ئەم ژمارەیە لەگەڵ وشەی(ئەلف)دا یەكئەگرێتەوە و لاشیوایە تا ٤٥١ی كۆچی ژیاوەو لەم بارەشەوە بەڵگەیێكی نەهێناوە.

مامۆستا(علاالدین سجادی)ش لە مێژووی ئەدەبەكەیدا ئەڵێ: بابا تاهیر هۆنەرێكی كوردی سەدەی سێهەمی كۆچی بووەو بەپێی هەندێ بەڵگەی مێژوویی دەورەی(صاحبی كوری عباد) و(ابن سینا)ی دیوە كە ئەمانە لە زەمانی فەرمانڕەوایی(بوەیهیە)كانا ژیاون. پاشان بیرو باوەڕی میرزا مەهدی خانی كەوكەبی كردووەتە بەڵگەو لای وایە بابا تاهیر لە ساڵی٣٢٤ لە دایكبووەو لە ساڵی ٤٥١دا كۆچی دواییكردووە. بەڵام ئەم بیرو باوەڕە هەڵەیە، چونكە بابا تاهیر لەو دووبەیتیەدا كە میرزا مەهدی خان لێكیداوەتەوە لە هەندێ وشەی خواناسی وەكو: نوختەو حەرف و ئەلف قەد باسی كردووە كە لە ڕچەی خواناسیدا(نوختە)بە واتای تیشكی خوایی و(حەرف) بە واتای لەش و ئەندامی خاوێن و(ئەلف قەد)یش بەواتای پیاوانی خواو پارێزكارە.

كۆنترین پەڕتووكێ كە لە بابا تاهیر دواوەو خول و سەردەمی ژیانی ئەوی بۆمان دەرخستووە، پەرتووكی(راحە الصدور)ی ڕاوەندییە كە لە ساڵی ٥٩٩ی كۆچیدا نووسراوە. لە ئەم پەرتووكەدا لە بارەی دیداری توغرڵ بەگی سەلجووقیو بابا تاهیرەوە وەها نووسراوە:"كاتێك توغرڵ بەگ هاتبووە هەمەدان، لە پارێزكاران و خواناسان سێ پیر لەوێدا بوون: بابا تاهیر، بابە جەعفەر، شێخ حەمشاد. كێوێك لە هەمەدان هەیە كە كێوی خدری پێئەڵێن، ئەوان لەسەر ئەو كێوەدا وێستابوون. توغرڵ بەگ كە سپاییێكی گەورەی لەگەڵدا بوو، هەر كە چاوی بەوان كەوت لە ئەسپەكەی دابەزیو لەگەڵ وەزیرەكەیدا(ابونصر الكندی) چووە لایان و دەستی ماچكرد. بابا تاهیر كە ئاگر پارەیێكی دڵراكێشەرو دڵڕفین بوو بە توغرلی وت: ئەی تورك لەگەڵ بەندەكانی خوادا چی ئەكەی: توغرل وتی: هەرچی تۆ بفەرمویت من ئەوە ئەكەم: بابە وتی ئەوە بكە كە خوا ئەفەرموێ: إنَ اللهَ یَأمُرُ بلعدلِ والاحسانِ. توغرڵ بە قسەكەی بابە دەستیكردە گریان و وتی: وا ئەكەم بابە دەستی گرت و وتی: كەوابوو بەڵێن ئەدەی بەو جۆرە كە خوا ویستوویەتی ڕەفتاربكەی؟ توغرل وتی: بەڵێ بەڵێن ئەدەم. بابا تاهیر سەری لوولە ئافتاوەیێكی (مەسینە)ی قوڕینی شكاو كە ساڵها دەست نوێژی پێئەگرت و بەسەر ئەمووستیەوەبوو دەریهێناو كردیە ئەمووستی توغرلەوەو پێی وت: ئەوا وڵكەی جیهانم كردە ئەمووست و پەنجەی تۆ، تۆش لەگەڵ بەندەكانی خوادا خاوەنی دادبە، توغرل دوای ئەوە هەموو دەم بۆ پیرۆزی ئەو سەرە لوولە ئافتاوەیەی هەڵئەگرت و ئەیكردە پەنجەیەوەو ئەگریا".

ئەم ڕووداوە مێژووییە واتە دیداری توغرل و بابا تاهیر كە هەروەها پلەو پایەی بابا تاهیرمان بۆ دەرئەخا، مێژووی ژیانی ئەویشمان بۆ ڕوونئەكاتەوە.

